


# حیكایەتی بیابان و نزای تەیرەكان

محەمەد حاجی كەریم

2005




ناوی کتێب: حیکایەتی بیابان و نزای تەیرەکان

نوسەر: محەمەد حاجی کەریم

تابلۆی بەرگ : پابلۆ پیکاسۆ

بەرگ: ڕەگەز رەشید

تایپ: سیروان مەحمود

دیزاین : هاوار جەبار

ژمارەی سپاردن :

چاپخانەی :

تیراژ : 500

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیریی سۆران

پێشکەشە :

به قوربانیانی دەستی جەلاد ، کە کارەکتەرەکانی نێو ( حیکایەتی بیابان و نزای تەیرەکان ) پێکدەهێنن .

ـ با ـ

لە بیابانەوە تەیرەکان ئەگوازێتەوە دەریا
دەریا لە پیریەتی ئەم شـــەو ڕادەمێنیٚو
گویٚ لە نمەی باران ئەگریٚ
باران لە ئاوێنەی ڕۆحم ئەنوسـیٚ
تۆ تا ئەبەد بەدەری لە زەمەن
زەمەن لە ژێر لقی ئەو دارشـاتووە خەوتووە دا
ئاماژە بۆ ئەو گڵۆپە ئەکات
کە لەو بەری ئاسمانەوە کتێب ئەخوێنێتەوە
کتێـب بە دیار پێکەنینی
شـــەپۆڵە شـێتەکانی دەریا خۆی ئەکوژیٚ
کوشـــتن بیٚ تێفکرین
پەنجە ئەخاتە ســـەر دڵی نیشـــتمانێکی وێران
نیشـتمان خۆی بە دەمامکی مردن هەڵدەواسـیٚ
مردن لە چاوتروکانێکدا
هەموو شـــەوقی چراکان ڕائەماڵیٚ
شـــەوقی چراکان

لە بیابانەوە جەستەی خـۆڵاویم جێ ئەهێڵیو
بۆ هەتا هەتایە
بەگەرمای هاوین و
دووکەڵی شەرِگەو
سەرابی بیابان ئەم ســپێری
لە خەوداو
لە بەئاگایدا
شــتێک پێ لە رِۆحـم ئەنێ
ئەمکـوژێ و نامکـوژێ
خەونە جوانەکانم وردوخاش ئەکاو
لە نیوە شــەوێکدا ئەمگەرِێنێتەوە
دوورگەیەک لە خەیاڵ
خەیاڵ بە بۆنی جەنگ دامدەپۆشــێ
جەنگ پێش ئێسـتا لێرەبوو
جەنگ چرایەک لە دواوە ئەکوژێنێتەوە
کۆشـێک وەیشـوومە فرِێ ئەداتە ئاوەدانی
دارو پەردووی ئاوایـی ئەســـــوتێنێ

مـەزراکان و

باخچەکان و

کانییـــەکان

بە تەمێکی ســـــوور ڕەنگ ئەکات

جەنگ لە جامی پەنجەرەکانەوە ئەنووسیٚ

لە پەیدابوونی ئادەمـەوە

کۆشـــکەکان تورەگەیەکن لە خۆڵەمێش

ژیان کەشـــتییەکی شــــکاوە

ڕەچەڵەکی ئەچێتەوە سـەر ســـــفـــر

قافلەکانم بیردێنەوە

قافلەکان ... قافلەکان

قافلەی دەســـتی لەشـکرێک لە سـتەم

ئەم قافلانە چین ، کێی تیایە ؟

نامەکانی نیشــــــتمان

یان فەسـڵەکانی جوانی

ئەی جوانی بۆ ساتەوەختێک تەکان بدە

خەوشـــــەکان ڕابمـاڵـە

دەزانیت

ئەم دورگەیە شـتێکی تیایە، بەمەرگی گول و

مـــەرگــی ئاوو

مەرگی ئینسـان

پێ ئەکـــــەنـێ

خۆت بینیت ئەی ویژدان

لەشـــــکـــری جـــــەهـــل

هەناســـەی ترشـــاوی خۆی

بەرەڵای سـاباتە زەیتونیەکەی ماڵمان کرد

کەچی تۆ بێ دەنگ boovیت

نیشـــــتمان تەنیا

شـــــەقام چۆڵ و

کۆڵانەکان بێ توولە رێ

مەعبەدەکان بێکتێب

نازانــم _ با _ لە بیابانــەوە

نەخشـەی شـێواوی ئێرەی هێنا

یان بوودەڵەیەکی بەدمەسـت

لە سـپێدەی مێژوویەکی شـەکەتدا

خەونێک قایلیکردم بچمەوە ماڵە چکۆڵەکەی دوێنێ

ڕابـرِدووم بیـردێـتـەوە ..

بیرم دێتەوە کاتێک

نیگا ئاڵەکانی مانگ

بەهەموو شـــەفەقی خۆیان

پەلاماری تارماییان دەداو

ماڵەکانیان پرِئەکردین لـە بـۆنــی بـــخـــورد

بیرم دێتەوە کاتێک

گوڵە لاولاوەکان ســـپـێـدان زوو

ماچیان بۆ هەڵـدەدایـن و

جـوان جـوان خـۆیـان بۆ ئەرِازاندینەوە

بـیـرم دێتەوە کاتێک

کچە تازە باڵقبووەکان چاو سـاغیان بۆئەکردین و

بەخەتێکی ووردیلە

نامەی خۆشـــەویســتییان بۆ ئەنوســـین

بیرم دێتەوە کاتێک

ڕۆژە زیوینییەکان بێچرپە

جڵەویان لەشــەوە عاتیفە بارەکان ئەســتاندو

شـــەوە عاتیفە بارەکانیش

شــەفەقیان لە لاپاڵـــە ڕوناکەکان ئەدزی

بیرم دێتەوە کاتێک

دایکم دەســــتی ئەگرتین و

بەزۆرە ملێ نوێژی بەیانیانی پێدەکردین

بیرم دێتەوە کاتێک

شــەوان ئەســتێرەمان دەژماردن و

خەیاڵمان پر ئەبوو لە عەشــــــق

بیرم دێتەوە کاتێک

پێنج شــەممان جادەمان پرئەکرد لە قیژە قژی منداڵیو

خۆمان بۆ ئاهەنگی یەکتر ئەڕازاندەوە

توخوا تۆزێ ســـەیرم بکەو

بۆ هەتا هەتایە فڕێمدە نێو ( کەشـــتی ئاو ) *

خەیاڵ ئەمباتەوە

قەدەر ئەبینم پەنجە بۆ ووردە ئەسـتێران

درێژ دەکاو

پێیان ئەڵێ ڕووی تریفەیتان وەربگێڕن

ئەوەتا چراکان بەکزوڵی

لەتاو نەخشەی تێک ئالأوی ئێرە ئەکوژێنەوە

گوڵە جوانەکانی ئاوایـی

لەژێر تفڵی ( لـــــــــــم ) دا

وشــــک هەڵــــــــدەگەڕێن

ئاشـووب لێرەوە ڕەت ئەبێ ...

ئاشووب لەڕوخساری تاشـــە بەردو

ئاوازی ســــترانە ئاگرینەکانەوە

نەخشـەی نیشتمانێک ئەکێشێت

* شـــاکارێکی تاگور .

نیشـــــــــــــتمانی جەنگ و

نیشـــــــــــــتمانی خـوێن و

نیشـــــــــــــتمانی مـەرگ

ئەگەڕێمەوە دوێنێ ...

لە باخچەکان

کانیاوەکان

درەختەکان ڕائەمێنم

بە پەیژەی خانویەکی لەخشت دروستکراو هەڵدەگەڕێم

ئەڕوانمە ئەو بەری ئاوایی

ئەبینم

کتێبێک حیکایەتی _ بیابان _ و

ســـەفەری _ با _ ئەگێڕێتەوە

دەفتەرێک یاداشـــتی ڕۆژەکانی ئاشـــوب و

زەمەنی ئافات ئەنووســـێتەوە

وردتر ئەڕوانم .. ئەبینم

مناڵێکی نابینا لەو دیو قامیشـەڵانەکانەوە

بەدوای شـتێک ئەگەڕێ

لە پیاوچاکێک ڕائەمێنم

پەنجە بۆ شـــەقارشـــەقار بوونی زەوی درێژ ئەکاو

فیکە بۆ بەئاگا هاتنەوەی گوڵە هەنگوینیی‌یەکان لێدەدات

قومێک ئاو ، لەکانیلەی تفتیلکەکانی ئەو بەرەوە

ئاو ڕشـــێنی جوانیەکان دەکاو

دڵـی تەنیایـــــــی ئەداتـەوە

حیکمەتی پیاوێک

لەنوزەی ڕیشـوڵە مل باریکەکانی بەر مـــزگەوت ئەدوێ و

گوێ لە تەهلیلی مەغریب ئەگرێ

خاوەن ویژدانێک

پەنجە لە تەقویمی ڕۆژگاری مەرگ و

نەهامەتـی ئەخشـــــێنێ و

بە نەرمە ڕۆندکی زیوینی

ســــەرکۆنەی کوڵەکوڵیگەرمـای بیابان ئەکات

نزیک لە ئاشـــووب خەیاڵی منداڵی هەڵم ئەگرێ

کەیبانوویەک دەســت بۆ کولێرەیەکی لاسـوتاو دەباو

لە مەنجەڵێکی بوخاردا ئەیشـــارێتەوە

فاڵـگرەوەیەکی ڕووکوتراو

مژمژۆکە دەرخواردی ڕاهیبێك ئەدات

کرێکارێکی ماندوو

دەسـتی ئاوسـاوی بەپشـتی منداڵێکی وردیلەو

پیرەمێردێکیکەنەفت دادەهێنیٚ

بەسـالاچوویەك نوێژی سـپێدە دائەبەسـتیٚو

دوعا بۆ ماسـیە سـرِبردووەکانی دەریاو

گوڵە زەندەق چـووەکان ئەکات

نەرمە — با — یەك بەئەسـپایی لکە دارگوێزێکی خوڵەمێشـی

بۆ ئەشـکەوتێکی ورِ ئەگوازێتەوە

قرِژاڵێـك بەلالوتـی تێدەپەرِیٚو

بە دینارێك دارلاسـتیکێك بەمناڵێکی بزۆز دەفرۆشـێت

مناڵی بزۆز بەردێك لەگیرفانی دەرئەهێنیٚو

دەیخێوێنێتە جامخانەی ماڵێکی چۆڵ

زەلامێکی تەمەن ماش و برنج خۆی دەشـــــواو

تاقمەی ددانەکانی لەسەر تاتەشۆری بەرمزگەوت ون ئەکات

ژنێك بە هەناســە ســواریيەوە

وێنەی کچە عازەبێک

نیشـــانی پۆلەکورێک ئەدات

قەیرە کچێک لەو دیو پەنجەرەیەکەوە

فانۆس دائەگیرســـــــێنیو

گوێ لە گۆرانییەک ئەگرێ

بوک و زاوایەکی بەدبەخت

ئەچنەوە ســـــەرحیکایەتی لێک دابرانی ئازیزان

جاڵجاڵۆکەیەک بەدوای تەرمی کەروێشـکێک ئەگەرێ و

هەموو نەنگیەکان رەجم ئەکات

سمۆرەیەک تۆپەڵە قورێک لە هێلانەی پەرەسـێلکەیەک ئەگرێو

پەرەموچە بەر دڵی چۆلەکەیەک ئەگرێ

ئەم موستیلەیەکی ون،دیالۆگ لەنێوان کورێک وکچێک ئەکات

گەنجێک دوای ماڵئاوایی،هاوســـەرەکەی خۆی خۆشـدەوێ

بێوەژنێک داوای ماچێک لەمێردەکەی پێشـــووی ئەکات

ئاسمان دەســــــتی خۆر ئەگرێ و

رێگا بۆ تاریکی ئەکاتەوە

پشـیلەیەک سـەری خۆی دەلەقێنێ و

دووزمانی ئەكات

( عەتارد )* لە ئاسـمانەوە بەژیان دەڵێت : بەیانیت باش ،

ئەی ئەوەی كە نازانیت لە كوێ هاتووی

ژیان لەپشــت یەكێك لە چیاكان لە هۆش خۆی ئەچێ و

بۆنی باڕوت وەڕســــــی ئەكات

شـوانێك بەدوای بزنێكی عاسـێ

گۆپاڵ بەنێو مەخلوقێكدا ئەگێڕێ

لە گەڕانەوەشیدا ،بەرلەوەی عەفەویانە شمشاڵ بژەنێ

فرمێسك بەكەنارە مۆنەكانی ڕوویدا ئەڕژێ

كۆترێك فاتیحە

بۆ مەرگی جوانیە نەورەسیەكانی پۆلە تەیرێك ئەخوێنێ

دەگمێنێو

بەپەرەمـوچەی ژێردڵی،خۆی ئەكوژێ

مجێورێك لە سندوقێك هەڵی ئەگرێ

گۆڕێك بەتاڵ ئەبێ لەهێشوە ترێی نێو زگی مردوویەك

* یەكەمین ئەستێرەی دەوری هەتاو .

پرتەقاڵێك لەسەرخۆ گلۆردەبێتەوە سەر ئێسقی قوربانیەك

جەلادێك فیشـــەكێك ئەتەقێنێ و

نیشـــتمان تورە ئەكات

نیشتمان هەموو نەنگی‌یەكان ڕەجم ئەكات

چایەچی‌یەك لەولاوە

پیاڵە چایەكی ڕەش ڕەش

بۆ مردوویەكی نێژراو تێدەكات

مردن بەمردووەكە دەڵێ،بەیانی سەر بەماڵت دا ئەگرم

خۆر شـابالە بەبرشـتەكانی لێكدەداو

بەمردن پێدەكەنێ

دەست نووسێك بەڕاستە شەقامێكدا شۆڕدەبێتەوەو

نهێنییەك ئەدركێنێ

نهێنی ئەنفال وجەلاد

نهێنی مەرگ وخوێن

نهێنی خاش خاش بوونی زەوی و

كوێربوونەوەی كانیاوەكان

مەتارەی ناوقەدی جەنگاوەرێك پڕئەبێ لە هەڵم و

ـ  با ـ دڵۆپ دڵۆپ وشــکی ئەکاتەوە

قەرتارەیەک تریێ لە سەر پشتی ئەسپێکی مەجەڕی هەڵدەپەڕێو

ـ با ـ هەڵی ئەگریێو

دەی کاتە نێو جۆگەلەیەک

کرێوە لەولاوە

هەڵوژە گرمخییەکانی ژێر لق و پۆپی درەختە تەمگرتووەکان

بە کەرێکی قوبرســـــی لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەگوازێتەوە ڕۆژئاوا

شـــەبەقێک لە ئاوێنەدا خۆی ڕووت ئەکاتەوە

دەبینێت دەستێک بەدیار شــەوقی بلاجکتۆرێکی حەوت ڕەنگی

گۆمەمکێ ئەخاتە نێو بووخچەیەک و

بەدوای مەمکێک ئەیگێڕێت

پەندێک تەپ و تۆزی مێژوویەکی پڕخەوش ئەگێڕێتەوەو

نیقورچە لەدەمارە خوێنیەنەکانی زەوی ئەگرێ

گەنجێک

کەنازانم شـــۆرشـــگێڕە ، یان نەء

نازانم بەئاوی کام ئایدیۆلۆژیا خۆی ئەشـوات

بە بەردێکی بچکۆڵە حەرف حەرف وەسیەتنامەکەی

لە تەختایی گابەردێك ئەنوسێت ...

ســپێدەیەك خۆی ئەكوتێتە

نێو شـــــەوقێكی پاكیزەیـیو

بەدوایدا پێ لەچەوی بەرمزگەوت ئەگرێ ..

من ئەم ســـپێدەیە خەونم ئەبینی

لەناوەوەم بارێك ســـــەراب و

كێوێك تارمایی

لەدەرەوەم تێك ئالأنی شـــــتەكان و

ڕەنگەكان و

پیتەكان ..

نیوەڕۆیەك

بێپەروا لەپی خۆی خســتە نێو ئێوارەیەكی وەنەوشـــەیی‌و

خۆی تەڕكرد لە هەڵمی ژێرلقی دارهەنارێك

ئەم نیوەڕۆیە نیقورچەیەكم لە كراســی دڵم كردەوە

نهێنیەكی تیابوو كەس نایزانێ

مەگەر _ ئیحا _ی زەنگیانە بلوریەكانی گەردەنی بەلقیس

یان لەرینەوەی گەڵا جوانەکانی _طوبا_ *

ئێوارەیەک سـەتڵێکـی پڕ پۆتاسـیۆم

بەسـەر جەسـتەی شەوێکی ڕیشۆڵەیی

ئاسـەواری خۆی جێهێشـت

ئەم ئێوارەیە

بەپەڕەکانـی فەلسـەفەی غـوربەت

ژورێکم لە گژوگیای خۆشـەویسـتی چێکرد

جەسـتەمی تیا ڕاکشـاو

ڕۆحیشـم بەپەنجە بەفرییەکانـی

دەسـتی بۆ دیوانێک پەیڤ بردو

ئایەتێکی داپۆشـراوی بەگوڵەباخ خوێندەوە

شـەوێک وەک کەڤاڵێکی قامک شـپرزە

لە زەتی لە سـپێدەیەکی لێو بەخومار دزی

دەزانم نیگای ئەسـتێرەیەک

بەسـە بۆتێربوونی عاتیفەی دڵێکی زامـدارو

فێنک کردنەوەی تێنووترین شـار لە هاویندا

* درەختێك لە بەهەشـت .

ئەســـتەمە دڵۆپێك باران

جەنگ لەگەڵ تۆبکات ، ئەی تۆزو خۆڵی بیابان

بیابان ...

بیابانی کوشـتنی خەونەکان

بیابانی تەنیایی و

بیابانی مـــەرگ ..

من لە تەنیایـــی و

لەئـــــاوەدانـــی و

لەخـــــــــــەون و

لەڕابـــــــــــون و

بـــەئـــاگـــایـــــدا

تۆ ئەبینم ، ئەی ســـیمبۆڵی کوژانەوەی ڕوناکی

تۆ هەمیشە دەرگا بەڕووی دڵەکوتێی شەڕگەکان ئەکەیتەوە

لەکەنارە جێماوەکەی عەشـــقدا

بێ دوودڵی ئەفسانەی ژێرچنگی ( ئارس )* ئەڵێیتەوە
تۆ لە جنســـی یاســـای غوبارســـتانیت و
ئەگەڕێیتەوە زەمەنی بەردین و
دۆخی بێدەنگی ...
دەبینم بە دەســـتێکی ئاســـنین و
بێ پرســـیار
ئاماژە بۆ شـــتێک ئەکەیت
بە – با – ئەڵێیت :
تکـایە نەوەکانی هۆزی باوە کوشـتەی عروبە
بە ( لم ) داپۆشــــە ...
من پێش ئێســــتا لێرەبووم
لەدوورەوە گوێم لەنوزەیکۆترەکان بوو
بە باوەشــــی نزاوە
لە ســــوتانی هێلانەکانیان ئەڕوانی
دەنگێک شـــعورم ئەگەڕێنێتەوە دواوە
دواوەی لە دایک بوون و

* خوای شـــەڕ .

دواوەی خەون و

دواوەی تارمایی

دەنگ .. دەنگ ..

دەنگی قیڕاندنی جەلادێکی خوێنین

دەنگی حاکمێکی ســـــاختەکار

دەنگــی پیلاتۆزو

تەقینەوەی بۆمبی کوشــــــندە

( نانۆبیــس*) لە نامەیەکدا بۆی نووســــیوم :

( سـکاڵەی مردووەکانی هەموو دونیام لەکۆڵ ناوە ..

هاتوم جەنگ بە بێحورمــەت بوونی گۆڕەکان بکەم

کێ ئەم هەموو ئێسك و پروسکەی فڕێداوەتە ئێرە ) .

من ئەڕۆم تۆ ئەی _ با _ ، حیکایەتی بیابان بنووسەوە

حیکایەتی تێپەڕبوونی قافڵەکان و

خۆ فڕێدانی ئافرەت ومنداڵی ســەرپردەکەو **

---

* لە ئەفسانەی کۆنی میسریدا خوای گۆڕستان بووە.

** ئاماژە یە بەڕووداووی خۆفڕێدانی ئافرەتێکی ئەنفالکراو ، کە منالێکی بە باوەشەوە بوو بۆنێو رووبار دەکا ، کە لە دەست ئەفسەرێکی بەدڕەفتار ئەم چارەنوسەی هەڵبژارد .

حیكایەتی ژنە دووگیانەكان و

تراژیدیای ســـەگە ڕەشـــە

سەیری كەژاوەی مردن بكە ، ئەی زەمەنی بێدەنگ

لە زەویەوە بڕوانە

بزانە چۆن گۆڕی منداڵێكی بێ ناونیشـــان

بەدوای گۆڕســـتانێك ئەگەڕێ ؟

لەئاســـمانەوە بڕوانە

بزانە چۆن سـێ پەپولە بۆ ونبوونی باڵەكانیان ئەگرین ؟

ســـەیركە ســـەیر چۆن ( عوززا ) *

بەگریانی شـــارێك پێدەكەنێ ؟

گەرمە — با - یەك

بە ( مردنی دوای نیوەڕۆ ) ** ئەڵێ :

حەشامەتێك گلۆر بۆتەوە قولاَیەك

نیشـــتیمان تەنیا

باخچـــەكان تەنیا

---

* یەكێك لە دوو بتە بەناوبانگەكەی هۆزی قورەیش .

** شاكارێكی هەمەنگوای .




کانیاوەکان تەنیا

شـــــــاخ تەنیا

ئـاگـر تەنیا

رووناکی تەنیا

شـــــەو تەنیا

ئای چەند سـەختە تەنیایـی

تەنیایـی ... تەنیایـی

هەمدیس چاوەکانم دوور دەڕوانم

لە دۆڵێک نورێک ئەبینم

سەریخۆی ئەخاتە سەرچەناگەی دوورگەیەکی کۆپی کراو

دەبینم بەرخێک بەدوای پەناگەیەکی ونبوو ئەگەڕێ

بازێک تەشـقەڵە بەرەوە ئاسـکێکی ماندوو ئەکات

بۆنێک خۆی ئەکات بەلووتی فرندەیەک و

دڵی پڕ ئەکات لەژهـــر

چۆلەکەیەکی جێماو

بەدوای هێلانە ون بووەکەیدا ئەگەڕێت

تاجەگوڵینەکان

خەفەت بۆ سیسبوونی ڕووخساریان دەخۆن

فریشتەکان تووڕەن

بەڵام ، دەنگ ناکەن

زەمەن ئەگەڕێتەوە دواوە

وەرزەکان بەتوندی بەریەک ئەکەون

ئینسانەکان

لەزستاندا ،گەرم گەرم ئەبن بە قەرەبروت

لەبەهاردا خوێنیان لێ ئەچۆڕێ

لەهاویندا ، دەمرن و دەمرن

لەپایزیش وەک وەرینی گەڵا هەڵدەوەرێن

تەمی ئاسمان سێبەر دەکات

نەورەسەکان دەفڕن و

بەخێرایی بەرزەوی ئەکەون

دەبینم شەبەقێک سیحری پاشگەزبوونەوە لە شەوێک ئەکات

کەچی تەم ومژ پەشیمانی ئەکاتەوە

چەرچەفی خامۆشی

بێ ئەوەی ڕوخسەت لەژیان وەربگرێت

پەنجـەرەکـــانی ڕوانین دادەپـــۆشـێ

ســـێـبـەرێکی مـەخـمـەڵـــــــی

خۆی ئەکات بەماڵی ئاســوودەیی

نەفسێکی مردوو چاوساغی بۆ لەشکری نەهامەتی ئەکات و

گۆڕی بێگوناهێک هەڵدەداتەوە

تێنویەتی خۆی ئەکات بەماڵی ئاو

کەچی ئاگری غەدر

دڵوپ دڵۆپ تەڕایەتی ئەســڕێتەوە

دیمەنی ئەمێســتا

بەدوێنێ و

ئەوێ ڕۆژێی زیندەگی ناچێ

( قەدی دارچنارەکان

لموزیان ڕووچوٚتە جوٚگەلە چکوٚلەکانی ژێر ســەریان

گژوگیا ڕەنگی زەردباوی پوٚشـــیووە

توولە ڕێ و ..کوٚلانە چکوٚلانەکانی ئاوایی

ئولفەتیان بە تاریکییەوە گرتووە )

شــــەڕ تەواو دەبێ و تەواو نابێ

شـــەرِ هەموو شـــتێک ئەبینیٚو
ئێمە پێشـــبینی ئەو نابینین
شـــەرِ دوای باران
نیشـــتمان ئەکاتە چەند لەتێک
لەتێک بۆ نێو قاپێک خۆڵەمێش
لەتێک بۆ قەنتەرێکی دوور لە ئاوەدانی ...
ســـــەرنج بدە ،
لە دوای عەسرێک سەیری ئاوابوونی هەموو شتێکم کرد
شتێک ، وەک ئاوابوونی مانگ بەڵام نەگەرِێتەوە
شتێک ، وەک ئاوابوونی خۆر بەڵام نەگەرِێتەوە
( جوانیەکانی بەرەبەیان
ڤینۆســـــی پاڵکەوتوو
شـــتەکانی ئەولای ســـروشت
شـــایەکەی مریەمی عــەزرا
مردنی مریەمی عەزرا )*

---

* پێنج تابلۆی بەناوبانگی ( بیلەر ، تیسین ، مۆران دای ، لووت ، ماتینیا ) خوێندنەوەکان وەك هوونەر ، نەوەك ڕووداوو.

جوانیەکان بە بەرەبەیان تێپەڕین و
ڕەنویەک دووکەڵ بەدوایانەوەبوو
ڤینۆس لەدەلاقەی تەم توماندا
پاڵکەوت و
خۆی لە تاریکیدا جێ هێشت
گوڵەکان لەتاو عەجولی — با — دا
خۆیان کوشـــت
شـــایەکەی ( مریەم )
پێی خستە سـەر فەرشـی مردن
مردن شەوی بۆ سپێدەباشەکانی ( مریەم ) هێنا
ئێسـتا بەدنکێک بینین
دوا نامەی نهێنی سـەمای ماسـیەکانم خوێندەوە
کە لەقەراغ قژی ئاڵی ئاو دا
بەدوای لەزەتی یاقوتەکان ئەگەڕان
کەچی تاشـــە بەردە لووســـەکان
بێبەزەییانە فریویان ئەدان

ئیتر نەم زانی نەخۆیان سەرخۆشن ، نە ئاو لەتەنیایدا

دەڵێن لەو ڕۆژەوە

تەنیایی مردوو

لەچوڵەوانیدا دای لەشـــەقەی باڵ و

لەئەشـــکەوتێکی شـــــــەو تێخەوتوو دا

ناو قەدی ڕەقەڵەی لەبەردێکی لەڕدا

دایکم ئەیگووت :

ئەو ڕۆژەی ئاوەدانی چەقۆی تێزا

هەر ئەو ڕۆژەش

جاری یەکەم

ژنێک فانۆســـی داگیرســـاند

شـــەڕکوژاندیەوە

جاری دووەم

ژنێک فانۆســـی داگیرســـاند

شـــــەڕکوژاندیەوە

جاری سێیەم

ژنێک فانۆسی داگیرساند

شـەرڕکوژاندیەوە

جاری چوارەم

ژنێک فانۆسی داگیرساند

شـەرڕکوژاندیەوە

جاری پێنجەم

ژنێک فانۆسـی داگیرساند

شـەرڕکوژاندیەوە

جاری شەشەم

ژنێک فانۆسی داگیرساند

شەرڕکوژاندیەوە

جاری حەوتەم

ژنێک فانۆسی داگیرساند

شـەرڕکوژاندیەوە

جاری یەکەم

ژیان لەتەمدا

جاری دووەم

باران لەتەمدا




جاری سێیەم

تەم لە پاکیدا

جاری چوارەم

تەم لە ئاوایدا

جاری پێنجەم

ماندوویەتی لەتەمدا

جاری شەشەم

تەم لە سـەراپای زیندەگی دا

جاری حەوتەم

مردن لە تەمدا

مردن لەچۆڵەوانیدا

تەنیا لە چۆڵەوانیدا

چۆڵەوانی لەچۆڵەوانیدا

لە فەزای چۆڵەوانیدا

هەموو شتێك پۆشاكێكی سـەیری پۆشـی

سەیر سەیر ژیان بە كوچە ڕەشتاڵەكانەوە

غلۆربۆوە دورگەیەكی پڕ لە موعجیزە

بازنەی گەمارۆ مـۆڕەی کرد

گەرمای نیوەڕۆ لە حەژمەت جەلادەگرکنەکانی

چەرخـی بەربەریەت دەســتەو دووعـا وەسـتا

ژنێـکی دووگیان

بەدەم ئاهی ژانێکەوە هاواریکرد

خودایە بەبەخشندەیی خۆت بمان پارێزە

خودایە بۆ خاتری

ئەو هەموو گیانلەبەرە بێ گوناهانەی

بێگوناهترن لە بنیادەم

ئەو ئاگرە بکوژێنەوە

من ئەوســا

لەتاو ئەو هەموو زوڵمەت و

جەردەیی و ڕەشــەکوژیەدا

حەپەســـام و

دام لەپرمـەی گریان

چاوەکانم داخسـتبوون

کەچی زەینم وەک کامیرا فلاشیان لە دیمەنەکان ئەدا

هەستم بەچەرخی زێرینی جەلادەکان کرد

کابرایەکی زامدار خوێنی لێ ئەچۆڕا

بەشەلە شەل قســـەی بۆ کردم

ئەو وتی : ئەترسم بڵێن خەرەفاوە

ئاخر زانیوتە کوشـــتنی مەخلوقێک

بنیادەم فڕێبداتە عەرشی خۆشی ؟!

درۆت بۆناکەم

خۆم بینیم

منداڵێکی ساوا مەمکی دایکە مردووەکەی ئەمژی و

ئێلینجی ئەدا

کەچی کەسێک کە لە دەعبایەکی ترسناک ئەچوو

تەعزیی ئەداو

پێ ئەکەنی

گەرما هەموو شتێکی دەپرژاند

کەڵەکێوی و ماین

پەلەوەروکوکوختی

پەڵەی خوێنیان ئەدا

پـوش و پـــەڵاش
گـوڵــە کـێـویـلـە
دەغـڵـی ســـــــاڵ
کـتـێـبـی ئاسـمانی
کۆلارەکانی منداڵی
گـرِیـان گـرتـبـوو
ئاشـــــووب خۆی ئەکرد بە دەرگایەك و
وەك _ با _ لە پەنجەرە ئەچووە ژوورەوە
ئاشـــــــووب ئەبوو بە کەڵەگاو
ئەی وت: پێش ئێســـتا لێرەبووم و
ئەبێ هەر بگەرِێمەوە مێرگی ئەرخەوانی
دووکـەڵ خۆی کردبوو بە بۆنی پونگـــەو
بە دەســـــکێك تیخـــی خـــوێنینـــەوە
لاســـــــکی گوڵە شــــــــــەوبۆ
گـوڵـە باخ و
گوڵە یاســـەمینەکانی برِیو
کچیەتیکچە تازە عازەبەکانی

گـەڕانـدەوە عـەدەم

دوکـەڵ وەک تۆف و زریان

یەک یەک پەڕەکانی ڕۆژمێری مێـژووی دڕاندو

چرکە چرکی کاتژمێرەکانـــی

خســـتە کیســـەیەکی ئاگرینەوە

دووکەڵ بڵاوەی کردو

هەمـوو ڕەنگـەکان و

ڕۆژەکانی داپۆشـــین

ڕەنگی ســــــەوزەگیاو

ڕەنگی چـراکـــان

ڕەنگی خیوەتەکانی ئەوبەر ئاوایی

رەنگی ئـاو

ڕەنگی درەخت

ڕەنگی بـەفـر

ڕەنگی شـــەممـەیەکی ســـپـی

ڕەنگی یەکشەممەیەکی پەمەیی

ڕەنگی دووشـەممـەیەکی ســــــــەوز




ڕەنگی سێشـــەممەیەکی ئەرخەوانی
ڕەنگی چوارشەممەیەکی وەنەوشـەیی
ڕەنگی پێنج شــەمـەیەکــی کـاڵ
ڕەنگی هەینیيەکی شــین
( شـاخ بەدووکەڵــەوە
ئاوایی بە دووکـەڵـەوە
ئاسـمان بەدووکەڵەوە )
ئەو ڕۆژە بەدوای چنگێک هەتاو
تیشــــکێک ڕووناهـــی
هـەمـــوو کـێـوەکـان و
باخچەکانم کێومــاڵ کرد
کەچی جگە لە پەل و پۆکەوتنی ئاوەدانی
شــتـێـکی ترم نەبینی
ویستم وەک کەروێشـکێکی مـاندوو
بۆ حـەشـــــــارگەیەک غاربدەم
کەچی شـووشـەیەک دڵی شکاندم
ویســتـم وەک تەیرێکی باڵــکـــــروزاو

لە هێمنترین كونجی نیشـتمان بنیشـمەوە
كەچی نیشتمان بەجەسـتەیەكی خۆڵەمێشـی و
دوو دەســــــــتی ســــــــوتاوو
رۆحێــكی خـــــوێنینەوە
ســــــەیری ئەكردم و
لە چـــــــاوەكانیـەوە
دڵوپ دڵۆپ رۆندك دەرژا
هاوارم كرد
تازە من وەك ( هەمەنگوای ) خۆم ئەكوژم
كەچی پیاوێك وتی :
تۆبێ هوودەیت ، چۆن دەبێ بەرماڵی بێ هودەیی
بەســـــەر جەســــتەی پەشــوٚكاوت رابخەیت
ســــــەعاتێك بیرم كردەوە ...
بەدەر لە تورە بوون ، خۆكوشتن نە لە عیشـــقەوەیە
نە لەجـوانـی ...

( ئانارشــیەت )*ێکی تاڵەو

خۆم لە تۆزی ئانارشــیەت دادەتەکێنم

بێ ئومێدی مەیلێکی پووچــە

دەچم ڕووداوەکان وەک حیــکایەتی مێـــژوو

بۆ ( ئاتاشـــــا ) ** ئەگێڕمەوە

ئەگەڕێم نای دۆزمـەوە

ئەی دۆزمـەوە

پێم ئەڵـێ :

( پیرەژنێکی چەند ســەیریت ، ئەم پرتە و بۆڵەت لەچیە )

ئێســـتا زانیم دونیا دروشـــــــــمێکی ڕووتـە

ئاخـرخـۆت وتت :

من لەجنسـی تۆم

کەچی بەدیار مەرگی من دانیشــتویت و

دەنگ ناکەیت

لە ئازارەکانم ڕادەمێنیت و

* ئاژاوە .

** پیاوی باڵوێزخانەکان .

تێر تێر پێئەکەنیت

تۆ ئەزانیت

بکوژی جوانیەکان

رێز لەئـاقیبـەتی باران و

رۆشـــنایی ئەسـتێرە ناگرێ

ئەســـــــــتێرە ئارەزووی

بینینی ( ئانارشـیەت ) ناکات

هەتاو پاڵ بەتاریکیەوە ئەنێ و

ژیان وەک شـیعر دەنوسـێتەوە

شـیعر دڵی خۆی بۆ خۆر ئەکاتەوە

خۆر نەخشـەی میللەتێکی بێخەوش ئەکێشـێ

خۆر گۆرانی ئەڵـێ

بە ســـێبەر دەڵێ :

گەڵاکانی ئەو بەری پردەکە جوانن

گەڵاکان ســـەما بۆ عەشـق دەکەن

لە بەفر دەپارێنەوە

بە بەرگی خۆی ، نەیان تلـێـنێـتەوە

عەشـق پانتایی زەوی دادەپۆشـێ

بەڵام  کابرایەکی جل زەیتوونی

( دەزانم ، لەدرندەیدا بێ وێنەیە )

بە دوو چاوی خوێن تێزاو و

دوو دەســتی ئاســنی و

شـەپقەیەکی سەربازیی

هەموو رەنگەکان ئەسرێتەوە

ئەو دەڵێ : ( قاتیل بوون سیفەتێکە لەسیفەتەکانی خود..

ســونەتێکە ، لە ســـونەتەکانی ژیان ..

ژیان ، بە ئانارشـــــیەتەوە جـوانـە

ژیان ، بە رەنگـی خوێن و

بۆنی لاشــەی بۆگەنی و

شـــــــەری خـێـڵ و

شــــــەری شـــــارو

شــــەری دونیا جوانـە ..

دوان بەزمــانی گـــــوڵ

پیربوونی مانای شــتێکە

کە لەسەرەتاوە ئیفلیج بووبێت ) .

زانیومە

ئەفسانەیەک دەڵێ :

( ئـــاژی ) لە چـاوتروکانێـکدا

سـیحری لە پیرۆزیەکان کردو

نیگا جـــوانـەکـانی ڕامـاڵـیـن

زانیومـــە

( منیرفا )* بە فەلســـەفەی شـــەڕ

دڵی ئاشتـــــــەوایی ڕەنجــاند

شـــتێکم خـوێندەوە

( ئۆدیـب )** باوکــی خۆی و

( هاملێت ) مامی خۆی ئەکوژێت

زانیومـە

---

* خواوەندی پەندوشەڕەو پەسەندترین گیانەوەرە بەلای کوندەپەپۆوە .

** کـوڕی پاشـایەك بـوو دوای لێـك دابڕانێـکی زۆر لەڕێیـەك تووشـی بـاوکی خـۆی ئـەبێ ، بێئـەوەی بزانـێ باوکی‌یـەتی کوشـتی ، پـاش ماوەیـەك ڕێـی ئەکەوێتـەوە شـارەکەی ، بڕیـاریش وابـوو هەرکەسـێ پاشـای کوشتبێ لە شوێنی ئەو بکرێ بە پاشا .. بۆیە ئەو کرا بە پاشاو شاژنی لێ مارەکرا.. دواتر کە بە هەقیقەتی ڕوداوەکە زانرا...دایك خۆی هەڵواسی و( ئۆدیب )ی کوڕیش هەردوو چاوی خۆی هـەڵکۆڵی و وڵاتـی بـەجێ هێشت ..

بەپێی شـەریعەتی خوێن

مەســیح لە خاچ ئەدرێ !

زانیوومە ..

لەو دیوو پەنجەرەی ڕوانیندا

سـەرتاپای یوسف نوقمی خوێن ئەکرێت ..

بەڵام نەم زانیـوە

بەشـەریعەتی خوا

پەڕەکانی میللەتێك لەت لەت بکرێن

ئاشـــــــــــووب

چ کارەســاتێکی هێنا

ئاشـــــــــــوب

خۆی کوتایە هەموو ماڵێك و

یەك یەك

هەموو ئاوێنەکانی

وردو خاشـــکردن

پەنجەرەکانی بە پەڕۆی ڕەش داپۆشین

کانیاوەکانی کوێر کردنەوە

باخچەكانی وشـــك كردن

خەونـەكانی ســـــڕینـەوە

( خەونە ئەرخەوانیەكانی منداڵی

خەونە ئاڵەكانـی هــەرزەكاریی

خـەونە ســـپیـەكانی پیریەتی ) ...

ئەنفــــــــــــال ........

ئەنفال سووڕەتێكە لەسووڕەتەكانی ( خوا )

كەچی لەشـــــــــــكری ( تیرانی* )

پیتە پیرۆزەكانی ئاوەژوو كردنەوەو

دایوەراندنە ژێر پۆســــتاڵی غەدر

چ چارەنوســـــێكە

من لەوســـــــــاوە

بەنیگایەكی تەپ و تۆزاویەوە

لەنێوان ئاوایی ســــــووتاوو چۆڵەوانیدا

بەدوای ئایندەی ڕەشی خۆم ئەگەڕێم

دەگەڕێمەوە خەونێك ..

* دەوڵەتی ستەمكار .

جارجار بە سواریی گالیســــــــکە ئاڵتونیەکەی ( ئەپۆلۆ )* و
جارجاریش
بەسواری گالیســـکە زیوینیەکەی دایانا
ئەو پەڕی ئاســــــــمان و
ســـەرتاپای زەوی دەپشـکنم
شتێك نادۆزمەوە
جیا لەخــــــوێن و
تیزاب و باڕووت
دروێت بۆناکـەم
ئەوێ ڕۆژێ خۆم کرد بەماڵێکدا
نهێنیەکم نەبینی
پێم بڵێ دواڕۆژت خێر ..
ماڵێــك :
خانویەکی دوونهۆمی
نهۆمی یەکەم : شەش نێوان چوار دیوار

* خوای مۆسیقاو دەرمان ویارمەتی وهەڵوێست .

نهۆمی دووەم : دوو نێوان چوار دیوار

نهۆمی یەکەم : نێوان چوار دیواری یەکەم : پێشوازیی

نێوان چوار دیواری دووەم : خەوتن

نێوان چوار دیواری سێیەم : کۆگا

نێوان چوار دیواری چوارەم : چێشتخانە

نێوان چوار دیواری پێنجەم :گەرماو

نێوان چوار دیواری شەشەم : W.C

نهۆمی دووەم :

نێوان چوار دیواری ژووری یەکەم : کتێبخانە

نێوان چوار دیواری ژووری دووەم : دیالۆگ

لە نێوان چوار دیواری نهۆمی یەکەمدا

پێنج دەقیقـە

بە دەنگە دەنگی ڕابردوویەکی لەیادکراو ئاشـنابووم

پێنج دەقیقـە

خۆم لەبلووسـێ وەرپێچا

پێنج دەقیقـە

دڵی ماندووی خۆم دایەوە



لەنێوان چوار دیواری دووەمی نهۆمی یەکەمدا

بیست و پێنج دەقیقـە

خەوتم

بیست و پێنج دەقیقـە

بیرم کردەوە

بیست و پێنج دەقیقـە

گریام

لە نێوان چوار دیواری سێیەمی نهۆمی یەکەمدا

دوو سەعات و پێنج دەقیقـە

پاشماوەی ژیانێکی بێکەسم بۆن کرد

دووسەعات و پێنج دەقیقـە

لەرزوتا هێرشـــی بۆ هێنام

دووسەعات و پێنج دەقیقـە

پەڵە وەهـمێـک ڕۆحی بردم

لە نێوان چوار دیواری چوارەمی نهۆمی یەکەمدا

پێنج سەعات و بیست و پێنج دەقیقـە

ئاگر بەدەنی داگرتم

پێنج سەعات و بیست و پێنج دەقیقـە

خوێنم لە بەرچـۆڕا

پێنج سەعات و بیست و پێنج دەقیقـە

مردم

لەنێوان چوار دیواری پێنجەمی نهۆمی یەکەمدا

بیست و حەوت ســـەعات و پێنج دەقیقـە

هەڵمێکی خەست بەسەر پشتم چەمایەوە

بیست و حەوت سـەعات و پێنج دەقیقـە

کابووس هەناســـەی گیانمی هەڵکێشـــا

بیست و حەوت سـەعات و پێنج دەقیقـە

_ *با* _ یەکی سـارد ڕووەو ئاســمان هەڵی گـرتم

لەنێوان چوار دیواری شـەشـەمی نهۆمی یەکەمدا

سـەدوسـی و پێنج سـەعات و بیسـت و پێنج دەقیقـە

بۆنێک لووتی گرتم

سەدوسی و پێنج سەعات و بیست و پێنج دەقیقـە

قەدەر فڕێی دامە نێو تابووتی مـردن

سەدوسی و پێنج سەعات و بیست و پێنج دەقیقـە

دووکەڵی جگەرەیەک ڕەنگی لاســمێڵێکی بردم
لە نێوان چوار دیواری یەکەمی نهۆمی دووەمدا
شەســەدو نەوەدو پێنج سەعات و پێنج دەقیقــە
بێ هۆش کەوتم و
لەو دیوو تاریکیەکانەوە
تێر تێر ڕامام
شەسەدو نەوەدو پێنج سەعات و پێنج دەقیقــە
حەپەســــــام و
بە نیگای چاوەکانمەوە
ڕەنگێکی خۆڵەمێشــیم بینی
حەرف حەرف هەڵدەکروزا
شەسەدو نەوەدو پێنج سەعات و پێنج دەقیقــە
تەنهایم پێچایەوەو
خەیاڵم بۆ مێژوویەکی‌کوژراو چوو
لە دوا ژووری نهۆمی دووەمدا
هەزارو سێ سەدو نەوەد سەعات و بیست و پێنج دەقیقــە
زەینم ئەی وت :

ئەی زەمـــــەن

ئازاری ناخ چەند بێ بەزەییە

هەزارو سێسەدو نەوەد سەعات و بیست و پێنج دەقیقـە

زمانم سیمای لاڵێكی پۆشــیو

لەگەڵ خۆی ئەدوا

هەزارو سێسەدو نەوەد سەعات و بیست و پێنج دەقیقە

ئاسودەیم سەفەری كردو

بەجەستەمی گوت ،ڕەنگە نەگەڕێمەوە

ماڵێكی چەند خەمناكە ......

لەدەمیەوە لیكی لەبەرئەرژێ

لەناخیەوە تەنها تێكشـــــكان

نیگەرانم

نازانم كێ فرێی دامە ئەم ماڵە پەرپووتە

دیوارەكان پێم ئەڵێن ، تازە خۆت داوەتە دەست نیشـتمانێكی

لەت لەتكراو

بزانە .. جاران ماڵێكی جوان ...

ئێســـتا بێ چرپە ...

ســـەیرکە گەر هەڵە نەبم

ژووری یەکەم :

کورســیەکی شــــکاو

ژووری دووەم :

چەرچەفێکی ئاوریشـــمی

ژووری سـێیەم :

جامخانەیەکی بێ دەرگا

ژووری چوارەم :

کووپەیەك ئاوی زەم زەم

ژووری پێنجەم :

سـەتڵێکی سـەرەو ژێر

ژووری شەشەم :

مەسـینەیەکی ڕەش هەڵگەڕاو

ژووری حەوتەم :

ڕەفەیەك کتێبی دڕاو

ژووری هەشتەم :

سـەبەتەیەك مێـوژ

بمبەخشـــــە ، ئەی ماڵی خۆشنوودی
نازانم چ خەونێك بوو گەیاندمیە ئێرە
ئاخر رۆژگارێك
ئێرە ماڵیگۆڕینەوەی هەموو شتێكی جوان بوو
كەچی ئێســـتا پڕ لە یادەوەریو پەرپووتی
گوناهێكم نیە لەوە زیاتر
هاتووم بە عاتیفەی باران
هەقیقەتی حیكایەتێك بگێڕمەوە
حیكایەتی _ با _ و
نزای تـــەیرەكـــان
حیكایەتی _ گورگە هارە _ و
شـــــــــــەڕی بەر دەرگا
درۆ ناكەم
خەریكە خۆم لێ ئەبێتە
دەڵە دێوی ناو پانتایی ( جـەنـگی ناو تەوێڵە ) *
دیمەنەكان ســـوێندیان داوم

---

* ناونیشانی شانۆگەرییەكی ( مەوریسیۆرۆ زنكۆف ).

حەقیقەتی شـــتـەکان وەک خۆی

لە سـێبەری جەسـتەوە

بگوازمـــەوە

بەردەم عەقڵی ئادەمیزاد

بە چاوانت دوور بڕوانە

تۆزێ سەیری ئەو دیوو جەنگەکان و

ئەوبەری درۆیەکان بکە

سەرەتای حیکایەتی خەونێک پێم ئەڵێ :

بەسەرهاتی هەموو ژوورەکان

وەک خۆی بگێڕەوە ..

ئێستا زانیم چاوەکانم لە فەزای ژوورێکی کچاندا

ئاماژە بۆشـتی دیکە ئەکەن :

ا شـووشـــەیەک عەتر

قـووتویەک ماکیـاج

گوڵە چکۆڵەیەکی یەخە

قردێلەیەکی ســـپی

مەمکدانێکی هەڵبزرکاو

ماكســـییەكی نارنجی

فیســــــــــتانێكی نیلی

ئەنگوســتیلەیەكی ئاڵتوون

فنجــانێــكی فاڵـگـــرتنەوە )

زەینم خۆی ئەكوتێتە ژوورێكی تر

نازانم چ ژورێكەو

دیوارەكانی بەحیكمەتی چ ڕەنگێك داپۆشــراون

هێندە ئەزانم

لە حەقیقەتێك بدوێم ، كە خۆم بینیوومە

حەقیقەتی شكانی ئاوێنەیەكی چوارگۆشــەیی و

پەڕ پەڕ بوونی ئەلبوومێكی هەشتاوهەشت ڕەسمی

ئیدی بەدووچـــاوی كزو خەماویی

سەرنجم دایە نەخشــەی ســیحرێك

لە فەزای تاریكیدا

غەڵبە غەڵبی شــەوێكم خوێندەوە

شـــــەوی خاشـخاشـبوونی ئاوێنە

شــــەوی خاشـخاشبوونی ڕەنگەكان

**لە نیگای یەکەم دێڕیدا**

**شەڕ بەری درەختەکانی هەڵوەراندو**

**فووی لەچراکان کرد**

**لە نیگای دووەم دێڕیدا**

**شەڕگوڵەکانی وشک کردن و**

**هەموو ئاوەکانی گلاْوکردن**

**لە نیگای سێیەم دێڕی دا**

**شەڕ بە شمشێری جەهل گیتارێکی شکاندو**

**سەمفۆنیای دوارۆژی هەفتەی هەڵوەشاندەوە**

**لە نیگای چوارەم دێڕیدا**

**شەڕ پەنجەرەی ماڵی ڕوانینی داخست و**

**پەڕەکانی دیرۆکی بنیادەمی لێک هەڵپاچین**

**لە نیگای پێنجەم دێڕیدا**

**شەڕ ژەهری کرد بەدەشتە پان و پۆڕەکەی خۆشەویستی و**

**گەرای مردنی داوەراندە بێستانی عەشق**

**لە نیگای شەشەم دێڕیدا**

**شەڕ ئاهەنگی پەیوولەکانی حەرام کردو**

سەمای چۆلەكەكانی قەدەغە كرد

لە نیگای حەوتەم دێرِیدا

شەر دوا پەیامی لێك دابرِانی بۆ كچان هێناو

خەونی كورِانی ســـرِیەوە

لەنامەیەكدا كچێكی بێ مراد بۆی نوسیووم :

( دەمرم و رِۆشنایی لە تولە كۆلأنێك جێم دەهێڵێ ..

دەمرم و لەنیشتمانی شەختەبەندو

تاوێرە بەردەكانەوە

- با - هەڵم دەگرێ و

فرێم دەداتە مەملەكەتی غوبارستان ..

دەمرم و

( سەگەرِەشە ) مۆرِەم لێ ئەكا

( لم ) گەمارۆم دەدا

تەپ و تۆز گەمارۆم دەدا ) .

سەرم لەو موعجیزە ئانارشـــیە دەرناچێ

حیكایەتی شـــەوێك ئەم گەرِێنێتەوە ژووری شـكانی ئاوێنە

ســەیری خۆم ئەكەم




( بەچاوی پیاوچاکان
بەچـــاوی کتێبــەکان
بە چاوی ســـاڵەکان
تۆ ئەبینم ئاوێنە شـکاوەکە )
شێوەم لە ڕەنگی خنکاوێک ئەچێت
گەڕامــەوە دوێنێ و
دوا دوایەکانی زیندەگی
( زولێخا )م بینی
قەرتارەیەکی پڕکرد
لە خۆخ و سـێوە لاسـورەکانی نیشـــتمان
کەچی کابرایەک لە ڕەچەڵەکی ناپاکی
خســتنیە کامیـۆنێـکی ســـــــەربازیی
پەنجەرەیەک کرایەوە
ســێ ژن لەتەک
کەلە سـەرێکی خۆڵە مێشــیو
جامانەیەکی لاســـوتاو
پاڵـکـەوتبوون و

دەگریان

ژنی یەكەم :

من لەخەمی پیاوێكی بێگوناهــەوە

ئەڕوانمە زامی نیشـــتمان

ژنی دووەم :

من لە چرای كوژاوەی جەنگاوەرێكی زەلیلەوە

ئەڕوانمە تەمی سـەر جەسـتەی مەخلوقێك

ژنی سـێیەم :

من لە عیشـقی ئینسانێك بۆ نیشـتمانەوە

ئەڕوانمە گەورەیی خاك

ئەی نیشـتمان خۆت لەتەپ و تۆزی

سـالانی گەورەبوونی شــــەڕو

فیكری جــەردەیی و

قەلای خوێن داتەكێنە

خۆت بەتاڵ بكەوە

لەباهۆزی تەرم و

دووكەڵی باڕووت ...

ئەی نیشتمان لەدوورەوە تەماشـاکە

ئاسمان بۆنی ( سـێوە شـیرینەکە )و

خاك بۆنی کروزانەوەی لووت و

ئایندە بۆنی سوتماکی پوش و پەڵاشی گرتووە

گەردەلولی دەسـتی زوڵم

بەسەر پشـتی ئەسـپێکی لە حیلە کەوتوو تێدەپەڕێ و

گەمارۆی شـۆڕەبی بەر مزگەوت و

سـەوزەگیای بەرکانیو

پەرسـیلەی پێش مەکتەب ئەدات

ئەی نیشـتمان تەماشاکە

دوکەڵە بۆرە، تنۆك تنۆك

خۆی ئەکا بەخوێنم و

لە دەمارەکانم ئەوەسـتێ

ئەی نیشـتمان چێشـتەنگاوێک

سـەیری ژووری عومرم بکە

بزانە چۆن سـەرەتاو کۆتایم

دەگەڕێتەوە ماڵی خەم

نازانم حیکایەتی - با — سـەربوردەی منی پیٚ وتی
یان حیکمەتی خەونیٚک بۆی گیٚڕایتەوە
لەئەرشـــیفی میٚژووەوە
تاکۆتایی ئاوابوونی خۆر
یاداشتەکانم لە دۆزەخیٚک ئەچیٚ
هەمیشە کتیٚبیٚک ئەینووسـیٚتەوە
کتیٚبی پیٚغەمبەران و
کتیٚبی گەڕیدەکان
کتیٚبی پیاوچـاکان و
کتیٚبی جەنگاوەران
ئەی نیشـــــــتمان
ســـاتیٚ لەپەنجەرە بیٚ هیواکانەوە
چاوەنوقاوەکان بکەرەوەو
گویٚ لەنوزەی کەرویٚشـکیٚکی یەخسـیرو
نزای تەیرەکان بگرە
دایکان بەدەوری تەرمەکانی سـەدەی قەتل و عامی
گولٚ و ڕەنگ و

یادەوەریی و

ئاوەدانی ئەگرین ...

لەبەر تیشـكی گەرما

ڕەش هەڵدەگەڕێن

دایكێك بەباوەشـێ حوزنەوە

وێنەی منداڵێكی زویر

لەباخەڵی دەرئەهێنێو

تێرتێر ماچی ئەكات

( لەڕوخسارتەوە ئەتبینم، ئێســتا تەیرێكیت بۆنی بەهەشــتت گرتووە، تكایە ســـەفەرێك كودەتا لە مردن بكە و دەعوەتێكم قبوڵبكە .. ئێوارەیەك چاوەڕێت دەكەم،چاوەڕێ ......).

ئەی نیشـتمان چرایەك داگیرسـێنە

بانگی ئەســتێرەیەك بكەو

بەمانگ بڵێ ئەی جوانترین تریفە

ڕووت لەمێرگی ڕەنگەكان بكەو

تەمی ژێر پەلە هـــەورەكان و

خۆڵەمێشی سەر بەردەكان بە ڕەنگی نوێ بنەخشێنە .

دەرگایەک کرایەوە

مانگ بە باڵەکۆنەی خەیاڵی مندا تێ پەڕی

فریشـتەیەک هاواری کرد

لێگــــەڕێن

باڵە ناو قەدی گەردو تۆزو

گەرماو وشــــکەڵانیدا

دڵەکان بە ئیسـتاتیکای گوڵ ئارامبنەوە

روانین فێری کردم

بەدیار پارچە چکۆڵەکانی ئاوێنەی شـکاو

نیگام داوەرێنمە ســـەر ڕەنگەکان

( زیووس )* ئاماژەم بۆ ئەکا

ئارامم ئەکاتەوە

پێم ئەڵێ

---

* خوداوەندی شکۆمەندیی و چاکە

لەڕوخساری جەنگ مەڕوانە
نەوەک ( منـیـرفا )
لە چاو تروکانێک بتکوژێ .
( هەتاو ) پەیامێـکی بۆناردووم
لە بەشـێکی نووســـراوە :
- با - لە جنســــــی منە
گژوگیا لەجنســــــی منە
ئاگر لە جنســــــی منە
تۆفان لە جنســـی منە
شــــەڕو جــــــەلادو
بکـــوژ
لە جنسی تۆن ، ئەی بنیادەم
جوانی نامرێ
ســــــــــپیەتی نامرێ
( جوانی ئیلهامی خۆشـەویستی‌یە لە فەزای بووندا
ســـپیەتی خەونی جاوێدانیە لە دڵی شـــەو دا )
ســـەربوردەی ئەم نەهامەتیە تەواو نابێ ...

نیشـتمان لە ئامێزی جەنگ و

بۆنی بارووت و

سـڕینەوەی ئینسـانەکان

نوقمی ترس و

خوێن و

پرسـە بوو .

لێرە باران ئەبارێ

کەچی لە تێنوویەتیدا خنکام

دەرونم گەرەکییەتی

باس لە هەرەسی - بەفر - و

کوژانەوەی چراکان بکات

کەچی کەسیەتیم پێیگوتم

بەدبەخت بێدەنگ بە

تۆ غەرقی لمی بیابانێکی چۆلیت

بوونت غەریب .. غەریب بە دەوری خۆی ئەخولێتەوە

ســــۆزم ئەمگەڕێنێتەوە دوێنێ

بەخەونی نوستالیژیا مەحکوم نیم

ئاخر بە بەرچاوانمەوە

کەسـێک ،کەسـێکی نەگریسـی مەرگ دۆست

بە دوو دەســتی ڕەش و

دوو پەنجەی ئەمبەرو

دوو پەنجەی ئەوبەر

ئاگری لەســەفتەیەک کتێب بەرداو

بەدیار دووکەڵی پەیڤەکانەوە پێ ئەکەنی

( ئایەتە پیرۆزەکانی خوا

حەرفە هیلاکەکانی مێژوو

وتە دەگمەنەکانی ئەپۆڵۆ

نامە جوانەکانی شـتراوس

حیکمەتە نەمـرەکانی خانی

پەیامی لێبوردنی مەســیح

ڕۆحی یاســاکانی مۆنتســکۆ*)

من ئەوســا دەگریام

دەمەوت خودایە ...

---

* کتێبی بیریاری سیاسی فەرەنسا ( 1686 ) .

ئەم دوکەڵە نەفرەتیە چی‌یە ؟

بەخێرایی ئاســـــمان ئەکات بە تەم

روخســاری هەموو شـتێك دا ئەپۆشــێ

گوڵەکان ..

پەپولەکان .. درەختەکان ...

کێ ناڵێ وێنەکانی ئەم ئەلبوومەش

وەك ئازاری ئاوێنە شـکاوەکەی ئادەم

برینەکان نارۆشـێنن

تازە ئەم وێنانە هەموو شـتێکیان لەدەست داوە

تەنها مێژووی کارەسـاتی نیشـتمانێك نەبێ

وێنەکان لە تاریکیدا وەك چرا دادەگیرسـێن

لە ڕووناکی دا بەسـێبەری خەونێك خۆیان کۆدەکەنەوە

قاوغی دڵم ئیشـارەتم بۆ ئەکاو

ئەبینێ پیرەژنێك

لەمەرقەدی پیاوچاکێك

شـــیفا وەرئەگرێ و

لەو بەریشـیەوە

دەستێک ، دەستێک دەشکێنێ

پەنجەیەک ، پەنجەیەک ڕادەکێشێ

چاوێک ، چاوێک هەڵدەکۆڵێ

ددانێک ، ددانێک دەشکێنێ

زمانێک ، بوختان بە زمانێک دەکات

لێوێک ، تف لە لێوێک دەگرێ

ڕدێنێک ، ڕدێنێک دەتاشێ

گوێچکەیەک ، گوێچکەیەک دەنوشتێنێتەوە

سمێڵێک ، سمێڵێک بۆ یاخ ئەکات

پرچێک ، پرچێک ئەڕازێنێتەوە

- با - چ ئافاتێکی هێنا ..

ئافات بەدوای ئافات

فیتنە بەدوای فیتنە

فیتنە بازەکانی لەشکری نەهامەتی

بە شمشێری نەفامی

بەگژ ڕوخساری پاکیەتی و

ماڵی عەشــق دا دەچنەوە

جەهەنەم ئەخوڵقێنن

ژیان ئەکەن بەدۆزەخ

هەموو شـتێک

فریشـــتەکانی بە مزگەوت

منداڵە سـپیەکانی بەرمەکتەب

کوێر ئەکەنەوە ...

مانگ لەم شـــەوە نیگبەتیەدا

روناکی ئەدات

کەچی زەوی پێی ئەڵێ

کاتێک بەیاسـای غوبارو

بڕیاری جەنگـەڵ

سـەری مەخلوقێک بڕدرا

تۆ لەکوێ بوویت

ئەی پاشـــای شـــەو ؟!

ئەستێرەیەک ، دوعا بۆ پەیکەرێکی ئێسکین ئەکا

ئەزانێت

پاشـــماوەی زەمەنێکی تاڵە




زەمەن ، زەمەنی قەرەقوٚش

زەمەن , زەمەنی نائینسـانی

ئاســمان لە ( عیزرائیل ) ئەپرسیٚ

توٚ چوٚن توانیت لە چاو قوچانیٚکدا

حەشـامەتیٚک لە ڕوٚح بیٚ بەش بکەیت

ئەزانم توٚ خوٚت داوەتە دەست قەدەر

ئاخر دویٚنیٚ بوو

مانگ شـــــەبەقی لەتاریکی ئەدا

ئەستیٚرەکان وەک شەبەنگی خوٚر دائەگیرسان

ئاسـمان خوٚی پڕکردبوو لە سـامالٚ

ڕووبارەکان شـــەپوٚلیان ئەدا

باخچەکان ســـەوز ســـەوز

بە پیٚوە وەســــــتابوون

چراکان ئەدرەوشـانەوە

ئاسـکەکان شـاخەکانیان لەیەکترگیر ئەکرد

باران ئەباریو

بەفرکیٚوەکانی داپوٚشـــــی بوو

ئەســـپەکان ڕەت ئەبوون و

کۆترەکان هەڵدەفڕین

ئەفســووس لە نیشتـــمانی مندا

ڕۆژە جوانەکان بەســـەرچوون

ئاشووب ئافاتێکی گەورەی هێنا

هەموو خەونەکان درویێنەکران

هەموو ڕەنگـەکان پوکانەوە

نیشتمان لەنەخشەی زیندەگی جیاکرایەوە

درێژکراینەوە زەمەنی قابیل و هابیل

قافلەکان .. قافلەکان

لە بێ دەنگی‌یەوە قافلەکان هاتن و تێپەڕین

قافلەی کامیۆنە ســـــەربازی‌یەکان

خۆم بینیم

سـپیایی هەموو ڕۆحە شـەکەتەکانیان

گواسـتەوە _ ســــــــەحـرا _

ســـــەحـرای بێ مانا

ســــەحـرای لێواو لێو لەتەرمی داپۆشـراو بە _ لم _

توخوا لەم دۆڵەوە

سـەیری لاشـە سـوتاوەکانی شـەڕبکە

ئەو لاشـــانەی ،

لەشکری زوڵمەت بێگوناه گەماڕۆیدان و

بەربەریانە ئەتکی کردن

ئەمێسـاش هەڵمی جەنگ و

هەناسـەی تاعوون و

زرنگە زرنگی تانك و

نێزەی عـــــروبە

تەیرە زامدارەکانی چۆمەکە ئەگوازێتەوە بیابان

لە بیابانەوە - با — هەڵدەکا

تەیرەکان ئەگوازێتەوە عەدەم

- با - لە گۆڕێکی بەکۆمەڵ جێئەمێنیٚو

بە قەڵەمی خوێنینەوە

داســـتانێك لەدەفتەری دڵی ئەنووســـێتەوە

گوێم لەقرچەی ســـوتانی هەزاران کەس بوو

ـ ئاژی ـ گـەماڕۆی ئاوایی داو




لە چـرکە ســاتێک دا

گوڵەکانی ڕووت کردنەوە

دەڵە دێوێک نامە ئاوریشــمەکانی

خســتنە بوخچەیەکی لیخن و

فڕێی دانە کیشــوەرێکی بەدەر لەزەوی

ئاشــــــووب

چرا زیوینیەکانیکوژاندنەوەو

هەلهەلەی بۆ مردنی پەپوولەکان لێدا

دایکم پێیوتم :

کوڕم بەمردوویش لە یادم ناچێ

لە ژێر ســێبەری دارگوێزێک

لە تەک بنەمێلاقێکی جوان دانیشـتبووم

کەچی تارماییەکی خەســت

خۆی کرد بە ژوور ســەرم و

شـتێکی کوشندەتر لە ژەهری داوەراندە ئێرە

هەر ئەوســا جەستەم هەڵپرووزا

روخســارم مۆن مۆن هەڵگەڕا



ڕۆحم وەک تەزووی کارەبا لەرییەوە
لەنێوان لە هـۆش چـوونی خـۆم و
لەتە توانســـتێکی زینـدوو
غلۆربوومەوە بەلەمێکی بێســـەوڵ
موعجیزەیەکی ســـەیر بوو
تاوێ ئەمردم و
تاوێ بەهۆش خۆم ئەهاتمەوە
وەختێک ڕۆشـــناییەک خۆی کرد بەماڵم
وەختێک تارماییەک بەنێو چاوانم تێپەڕی
گوێم لەترپە ترپی پێی جانەوەران و
هەراو هۆریای قۆغـــەیەکی قوپاو و
گمەی نووســـاوی پاسـارییەکی ژاراوی بوو
مـردم و
بەرەو گۆڕێکی نادیار ســـەرم هەڵگرت
کەسـێک نەبوو پێم بڵێت
با ئەو تەرمە پروزاوە تەلقین بدەین
ســـــەگێکـی نوقســـان دەمـی لێدام و

ناشـــرینانە لەو دیوو پەرژینی بێسـتانەکە

جێی هێشـــــتم

ئارەزوم ئەکرد

وەك چۆن لەرۆحــدا مــردووم

لەجەســــــتەش رەق ببمەوە

تەنیا خۆم نەبووم

بەدرێژایی‌کەپکە شـاخەکان و

قولایی دۆڵەکانەوە

جەنازەکان بەغەریبی ڕاکشـابوون

ئەو ڕۆژە هــەوا پڕبوو لە ژەهـــر

( قەدیس )* دووعای بۆ کردین و

فەرمووی : یەزدان بەگەورەیت

بمانگەڕێنەوە بەهەشـتەکەی خۆت

لە جەنگ گەورە بووین و

* کەسایەتی ( قەدیس ) لە رۆمانی فرانسیسکۆس ( نیکۆس کازانتراکیس ) بەشوێن ئەو فەرمودانەی یەزدان ئەگەڕێ کە مرۆۋ هێمن دەکەنەوە لەشەڕو نەهامەتی دایدەبڕن ...

لە جەنگ گەڕاینەوە

باڵم گرت و

لە ئاســــمانی خەیاڵدا

ســەیری دەشـتاییەکی ســوورم کرد

بینیم لە شــەوســـتانی رۆحـدا

شـەبەقێک باســـی مـردنی ڕۆژو

شـەقار شـەقار بوونی جەستەجێماوەکەی زەوی ئەکات

یادەوەریـەک ئەگێـڕێـتـەوە

یادەوەری دووبارەبوونەوەی

زەمەنی جـەنگیـزو

زەمەنی هـوڵاکـۆو

زەمەنی تەیمورلەنگ

یادەوەری بەردەوامی

زەمەنی ناپلیۆن و

زەمەنی هیتلەرو

زەمەنی میلۆسۆڤیچ ...

هاتووم ، هاتووم

بە زەمیلەیەک سێوەوە

دەســـکێک ڕێواس

کوپێک شـــــەڕاب

بەدواتەوەم ئەی پیاوەکەلەپچەکراوەکە

خۆم داوەتە دەست ئەو ڕێگایە

چاو دەگێڕم ، لە بینین ناکەوم

ئەبینم :

لەکێڵگەیەکدا مانگایەکی برســــــی

تۆزی ســەرتفڵی بەردێک دەلێســێتەوە

ڕیشــــــۆڵەیەک هەڵدەفــڕێ و

لەشـینایی ئاسـمان دەپلیشـێتەوە

دەڵێی جیهان تاهەتایە خەوتووە

کەســێک ناڵێ

لەشکری تەجال لەو بەرەوە چاڵێک پڕئەکات

لەئینســـــان و

خەون وکاتژمێرو چاویلکە

لەوبەریشـەوە فلچە فلچ

بەخواردنی شــەکرە ســێوو

ســـــــورەخـۆخـی

باخچەکان ئەکات

نەنکم وتی :

ئەفسەرێکی جل زەیتوونی ،کیسەیەك خشڵی بەدەستەوە بوو

چاوی بڕیبووە چۆمی ژێرپردەکەو

بەســەربازێکی ئەوت :

پەرژینی باخچەکان و

دارســتانی ســەرپشــتی قەبرەکان بســوتێنە.

ئیتر ئاوایی پڕە لەپاشماوەی ئەوانەی بە تۆزی دووکەڵ مردن

دەستی شکاو ..

چاوی فیچقاو ..

قژی سووتاو ..

وردە ئێسقان ..

مەتارەیەکی بەتاڵ،بەمەلوولی لەقەراغ کانیاوێك خەوتووە

کوڵە پشــتێك لەخەمی خاوەنەکەی ژانگرتوویەتی ..

کەمن هاتم و

سەیرم کرد

لە دیوی پێشەوەی بەقەڵەم جافێکی شین نووسرابوو :

ئازادی ..............................

ئیتر بەر لەوەی بیری لێ بکەمەوە

چەند جارێک دەســــــتم پیا گێڕا

جاری یەکەم

جامانەیەکی دڕاو

جاری دووەم

عەلەتریکێکی شـکاو

جاری سێیەم چەخماخەیەکی نەوتی

جاری چوارەم

پاکەتێکی هاڵۆزاوی ( سـوومەر)

جاری پێنجەم

چنگێک نانەوشـکە

جاری شەشەم

قەڵەم جافێکی شـین

جاری حەوتەم

دەفتەری یاداشـتەکان

ئێسـتێکم کردو

بەڕوخسـارێکی کز

هەموو دێڕەکانی نێوم خوێندنەوە :

لە ئامێزی خاکێکدا عەشقی جوانیەکان بووین ، هەمووشتێکی جوان .. دەمان ویســـت هەموو شـــتێکـی بێ ماناو ئاوەژوو تورڕهەڵدەین .. دەمانویســـت بەنوری مەحـەبەت ڕوناهـی داوەرێنینە ئاقارەکانی ژیان .. ماڵەکانی نیشـــتمان بەبۆنـی نێرگزەجاڕ بڕازێنینەوە .. ڕەنگی عەشـق بگەڕێنینەوە شەقامەکان _ با _ ی ئاســـودەیی تێکەڵی خەونەکان بکەین .. گەرەکمان بوو بەگیتارەکەی ( ئافیـوس)* دڵی نەوەکانـی ئادەم  پڕ بکەین لەبزەی شـۆخەکچانی مەملەکەتی ئیرۆس .. دەمان ویست ( بەیۆدیس ) بڵێین تا هەتایە پاکمان بکەوە بەشـــــنەبای فێنـکی دڵی خۆت .. گەرەکمان بوو لەو دیوو تاریکی چاوانەوە ، کۆمارێکی ڕۆشـــــن

* لە داستانێکی ئەفسانەیدا یەکێك بووە لەهەرە مۆزیکژانە بەناوبانگەکان .

بە نوریی زیوینی خوا هەڵچنین .
ئێمە سـوێندمان خواردبوو :
زمانمان ، زمانی باڵندەو
ڕۆحمان ، ڕۆحی پەپوولەو
دڵمان ، دڵی باران و
چاومان ، چاوی ئەســتێرە بێ
ئێمە بەدەم نەغمەی کۆترەکان و
ڕوناکی تیشــکی هەتاو لە دایك بووین
لەیەکەم ڕۆژی بووندا
بەسـواری پایسکیلی منداڵیگەیشتینە مێرگی ئەم دورگەیە
دیوارەکانمان بەشــنەی گوڵەکان ڕەنگ کردن
پەنجەرەکانمان کردن بەدوربینی جوانیەکان
دەرگاکانمان خســتنە سـەرگازەری پشـت
باخچەکانمان پڕکردن لە کەناری و
خوڕەی ئاوو تامی گێلاس ..
کەچی ئەفســـووس ڕەتلە جەلادێکی خێڵی خێـو

نەوەکانی ( ئەبوو لهەول )*

وەحشـــــــــــی گەرانە

زەمەنی جوانی سروشت و

زەمەنی پێکەنینی بەرمانگ و

زەمەنی سـەمای خۆشـەویستیان

بەپلیکانەیەك غلۆرکردەوە عەدەم

لە ناوەڕاسـتی دێیەکاندا ئاوی کارێزو

دەنگی دەوار ئاوەکانیان بەئارەزویەکی شێتانە کوشـت

وەك ( ماســۆشــیەت )** پەنجەرەی ڕوانینیان شــکاندو

بەردێکی گەورەیان سرەواندە گیانی ئاوساوی ( میـوز )***

ڕێگاکانیان ئابلۆقە دان

دۆزەخیان بۆباڵندەکان نایەوە

کەشــتی ماســگرو گەڕیدەکانیان ژێر ئاو خست

گەڕانەوە زەمەنی پەیدابوونی حەواو

* لە ئەفسانە دا دڕندەیەك بووە سەری مرۆڤ و لەشی شێری هەبووە

** لەزەت وەرگرتن لەئازار دان

*** خوای شعر لای یۆنانیەکان

یەک یەک چرای ماڵەکانیان کوژاندنەوە

بەر لە ( عوقبا ) * کۆشـکە سـپیەکەی ژیانیان سـوتاند

لە یەکەم دەرگای مۆزەخانەی مێژوو چوونە ژوورەوە

بەبەرچاوی دونیا

گەنجینەی مردووەکانیان دزی

یەکە یەکەی پەڕەکانی ڕابردوویان لێک هەڵپاچین و

نامە سـپییەکانی سـبەیان سـورکردن لەخوێن

هەموو کتێبە پیرۆزەکانیان سـوووتاندن .

زەنگ لیّ دا ،

لە تاریکیدا زەوی ئەمانگەینێتە ڕۆژی حەشـر

لە دوای خەونی سـپێدەیەکی هێمن، شتێک پێی‌گوتم :

لە زەویەوە تامانگ لـوڕەی دڕندەو

هێرشـی بەربەریەت بەدواتەوەیە، ئەی مەملەکەتی خەوتوو

ئەڵێن لەوساوە

* ڕۆژی قیامەت

خاکێک لە ڕووداوی شـــەوێکدا
شێوەی مردنی پیاوێکی پۆشـــیوە
پیاوێک ڕەنگە شـەهیدێکی بێ گۆڕبێ
هەمدیس دێتەوە خەیاڵم
لەخەونی نیوە شـەوێکی پایزدا
فریشـتەیەک دەسـتی‌گرتم و
بە هێوری پێی وتم :
سـبەی لەکێڵگەی بەری ڕۆژهـەڵاتەوە بۆ مردنێک ئەگریم
مردنێک وەک مردنی ( ئاژاکس )* .. یان هەر مردنێکی تر
گریانی مەملەکەتێک ئەمگرییێنێ ..
ئەشـــێ لەتاوکوشـتاری بێگوناهەکان
پشـــــــــویەک بدەین و
سـەرو پێکێک گریان بخۆینەوە
بیرم ناچێ بەیانیەک لە تاو ڕاکردنی ژیاندا

* ئازایەکی شاری تەروادا بوو , دواجار لەتا و دەرەقەت نەهاتنی ( ئۆلیس ) خۆی کوشت

چۆلەکەیەك پێی گوتم : گەرگریان نەبووایە ئاوێنەی دڵت دەشـــكا ..

ئەبینم لە تۆڵەی گیانە مـردووەکان

خەونێك بۆکوشتنی ( ســـەگەدڕە ) ی بیابان دەگەڕێ

کەچی دوای زەمەنێك ئازایەتی و مێژوویەك بەرگری

لە خۆیەوە گەڕایەوە دۆخی مەرگ .

قافڵەکانم بیرهاتنەوە...

قافڵەکان .. قافڵەکان ...

لە داوێنی گوندەوە بۆ – لمی – بیابان

ماشێنەکان لە داوێنیگوندە سوتاوەکاندا بەنێو هەڵمێکی لیخن و سـوتماکی تەرمەکان و

گژوگیاو

قژی زارۆڵان و

نزاو پاڕانەوەی دایکان ڕەتبوون

ئەم زەمەنە چەند ســـــەیرە

ماشـێنە مەســتەکانی خەرابات

دەنێو دووکەڵ و خوێن و خیزاودا تێپەڕین

سـەرنشـینەکانیش ئارامی نێو دڵیان
بە باڵەکوتێی پەپوولەکاندا کەوتبوو
ڕۆحیان لەسـەرکەڤرو تاشە بەردە سوور پۆشەکان
ڕەنگێکی ڕەشـــــتاڵی ئەبەخشـــی
لە ماشـێنێکدا
پۆلەکچێك لە تاو دوڕانی جوانییەتیان
چوڕچوڕ ڕۆندکیان دادەوەراند ...
لە خوڕ ئاوای دێیەکەوە،گوێم لێبوو پیرەژنێکی پرچ سـپی
بە شوفێری ماشـێنەکەی وت :
( بووەسـتە .. بووەسـتە .. مـن لەقـەتپاڵی شـاخەکان ئـەمرم ..
مردنی بیابانم ناوێت .. تازە گەر بە جەسـتەش بـێم ، دڵـی مـن
لێرە جێدەمێنێ ) .
قافڵەکان تێپەڕین
لە عەرعەرەوە دڵی نیشـــــتمانیان بەئاگا هێنا
ڕۆحیان کردە برین و
ویژدانیان پڕکرد لە ئازار
لە هەر شوێنێ بم ، زیندوو، مردوو

**لەیادم ناچێ ( عەجاج )* چەند بەدفەڕانە پەلاماری‌کیژۆڵەیەکی داو**
**دڕندانە گەڕاندیەوە دۆخی جەنگەڵ**
**من ئەمێستا بەجەستە مردووم**
**بەڵام بەرۆح لەم بیابانە بەربەریەدا**
**بەدوای نهێنی کچان و**
**ناونیشانی‌کوڕان دا دەگەڕێم ...**
**( ئەم شەو لەخەونم دا تارماییەکم بینی وەك گورگی هار بەدەوری قشڵەیەکی سەربازی غار غارەی دەکرد، وتم ڕەنگە ئەفسانە بێت،کەچی ئەستێرەیەك پێی وتم نا ..نا ..ئەوە ئەو ئەفسەرە ئابڕو بەرەیە ، کە ڕۆژ تائێوارە و ئێوارە تابەیانی بەسەر لاشە خنکاوەکانی بیابانی هاردا مەست دەبێ و سەما دەکا ) .**
**خەیاڵ بردمیەوە کەلاوە ڕوخاوەکانی ئاوایی و**
**مەنجەنیقە تێك ئاڵاوەکەی ئێرە**
**فرندەیەك بە خێرایی نامەیەکی سەر ئاواڵی خستە دەستم**

---

*** ئەفسەرێکی ئەمنی بێ ئابڕو بوو ، خراپکاری زۆری دەرهەق بە ئەنفالکراوەکان کردوە**

هۆشـم پێی وتم :

بیٚ دەنگ هەموو دێڕەکانی بخوێنەوە

کەسـەیرم کرد لێی نوسـرابوو:

لە کەمانچەکەی ( مۆزارت ) ەوە بۆ ( گۆڕە نائارامەکان ) *

لە ژێر بارسـتایی قورسـایەکانی - لم - و

بیٚ دەنگیی دونیا دەتان بینم

دەزانم دڵی ماندوتان لەژێرسێبەری سیمرخە گوناهکارەکانەوە

پڕە لە زەبری جەلادو

جەنگ و

گەردەلول و

چەتەو ڕێگر

دەزانم هەموو ڕۆژیٚ ئەهریمەن دەتانکوژیٚ و

خوێن ڕێژیٚ لە خاچتان دەدات

ئێسـتا لەدامێنی باخچە قرمزیەکانی شـارێکی جوان

* ناونیشـانی لێکۆڵینەوەیـەکی ( د . کلایـد کـۆڵنز سـنوو )پسـپۆری بـواری ئـەنترۆپۆلۆژیای پزیشـکی دادی یـە , کـە سەرپەرشتی تیمێکی زانستی رێکخراوی ( میدڵ ئیست ووٚچ ) ی کوردستان کردووەو لە کانوونی یەکەمی 1991ش گۆڕێکی بەکۆمەڵی ئەنفالکراوانی لە گوندی کورێمیٚی دەڤەری بادینان هەڵدایەوە ،کە 26 لاشەی تێدابوو

لە سـپێدەیەکی سـپی ئەڕوانم

دەبینم لەئامێزی باخێکی ڕۆشندا

دەبن بەگوڵ ..

کەچی لەشـکری ئەنفال

بە دەرزەنێک شمشـێری ژەنگ گرتوو دەتان بڕێتەوە

لە هەڵفڕینی ڕۆحی پەپولەکانەوە سـەیرتان ئەکەم

هەموو ڕۆژێ دەمارە وەنەوشـەیەکانی نیشـتمان و

نیـگا ئـاڵـەکـانی خۆشـنوودی لە خـاچ ئەدرێن

بیرم ناچێ دوێنێ ئێوەم لەو دیوو پەنجەرەیەکی زەنگینەوە

بەدوو دارشـەقـەو

کۆشـێـک دووعـاو

کوڵێک خەزنەوە بینی

هەزارەها کەس بوون

دەڕۆیشـتـن و

جارجار پشـوتان دەداو

جار جار سفرەی خەمەکانتان ڕادەخسـت

هاوارتان دەکرد خودایە

بای چ قوتبێك فرِێی داینە ئەم بیابانە نەفرەتیە

ئەم عەردە کێویکە لەغوبار

دۆڵێکە لەژەهـــــــر

دەریایەکە لەتیزاب

چ وەحشەتێکە دەمانچە لەجامخانەی خۆشەویستی ئەگرێ و

جوانیە پاکیزەیەکانی عشـــــق ئەرِوشـــێنێ

چ خەراباتێکە ئەم زەمەنە

زەمەنی ســـــوتان

زەمەنی ئافـــات

زەمەنی بەجێمان لە – لم –

سوتان هەمیشــە برینێکی ســەختە لەرِوَح

ئافات هەمیشــە نەریتێکی تاڵە لەجەســتە

– لم — هەمیشــە تارمایەکی وشــکە لەدڵ

ئێوە باش ئەزانن

( ســـووتان ، ســـرِینەوە ، لم )

تائەبەد ســـێکوچکەی مەرگن

من لەزووەوە لەکەنار ئەم رِێگایە دانیشتبووم

کە ئێوەی پیادا ئەڕۆیشـتن

نازانم بینیتان یان نەء

من بەهەموو قەناعەتێکمەوە

بەکۆمەڵێك نۆتەو چەپکێ بەیبونەوە

ســــــــلاوم لێ دەکردن و

پێم ئەوتن دڵنیابن پاش چەند لەحزەیەکی تر

ڕۆحتان ئەگەرێتەوە ئامێـزی ئارامترین تریفە

ئەم ڕەشـــە بایە تێدەپەڕێ و

ئێوە لەئاســــمانی پاکیەتی دا

زیندوو زیندوو .. سپی سپی

بەچەشــنی مانگ دەمێنــەوە .

ا لە نێو کێڵگەکەدا

بەخەم ساردیەوە پاڵی لێمەدەرەوە

زۆر بەرەو بەرزیش هەڵمـەزەنێ

جـــوانتـرین ڕوانینـی ئەم جیهـانە

وا لەنێـو جەرگــەی ڕێگـــادایە )*

بەعــەزرەتەوە

ڕابردووی لەت و پەتم دەپێچمـەوە

لە حەزینترین سـاتە هێمنەکانی دڵدانەوە دا

بیر لەشکانی ئەم هەموو ئاوێنە رووســپیانەو

کوژانەوەی ئەم هەموو چرایانە ئەکەمـەوە

دونیا ئەبینم لەســەر پشـتی ئێسـقان

نەخشەی دوبارە بوونەوەی مەرگەسـاتەکان دائەڕێژێ

لە لەتەعشـــــــــقێکمەوە

چاوەکانم دەبرمە دارتەرمی نادیارترین مەخـلوق

ســەیری گۆڕە نائارامەکان ئەکەم

ئەمێسـتا موسـافیرێکی ســەرهەڵگرتوم

- با — ئەڵێ مەترسە دەنێو ساباتە میتافیزیکییەکەی ڕۆحدا

لە ڕۆیشـتن و پشـودان

لە خەوتن و خەوبینین

* دێڕە شیعرێکی ( فریدریك ) ە..

پاسـەوانیت ئەکەم

من نەخشـەی هەزاران ساڵ و

نامەی مێژوویەکی دوورو درێژم لەوێستگەکانی چاودا هەڵگرتووە

ناهێڵم کەس ئەرشـیفی نێو لەشـم بپشـکنێ

ناخم پڕە لەڕووداوو

پەیمانی ئاشـتی و

شـــەڕو لەدایک بوون و ماڵئاوایی

ئەزانم هاوکێشە پێک ناکۆکەکانی بەر لە جەنگ و دوای جەنگ

بەغەریبی لە کۆڵانە تەسکەکانی زەمەن سـەر دەنێنەوە

ئەزانم هەمـوو ڕۆژەکان و

وەرزەکان و ساڵەکان و سەدەکان

نهێنی شەڕێکیان هەڵگرتووە

شەڕێک تا ژیان مابێ

بخورد بۆشـێتی دائەگیرسـێنێ .

سـەر لەنوێ خەیاڵ ئەمباتەوە

لە پانتایی حەرفـەکان و

ڕووپەڕی کتێـب و

لاپەڕەی ڕۆژنامەکان ڕابردووی فریوو خواردو
ئاماژە بەدۆڕانی ئایندەیەکی تر ئەکات
دوێنێ دەستی خستۆتە بناگوێی ئەمڕۆ
پێی ئەڵێ تەنها سەراب ئاینده ڕووت ئەکاتەوە
ئەمڕۆ لەتاو تێکشکانی پەراسوەکانی
بەزەمەن ئەڵێت تۆ ئەفسانەیەکی سەرخۆشی
دۆزەخێکی سەرسەختی
هەموو چرکەساتەکانی ژیان
توانەوەیە لەتونێلی فەنابوون
بەیانیت لە بیابانە ترساوەکانی گوناهدا وەڕس ئەبێ
خولیاکانت لە یاخی بوونێکی سەرکێشانەدا
بەچەشنی گوڵ هەڵدەوەرێن
سەر خۆشیت و
قاچەکانت
دەستەکانت
پەنجەکانت
بەئاشفتەی جەنگەکان شکاون

بە ئاسـمان ئەڵێی لەجنسـی تۆم

کەچی ئاوێنەیەکی ڕووشـاوی ماڵە سـوتاوەکەی نیشتـمانی

پەنجەرەی شـکاوی ژورێکی خوڵەمێشـی

سەدەیەکە دیوارەکانت بەدەستەسرِی خوێن و گوناھ داپۆشراون

زەمەن ئەڵێ ئەم سـەفەرە تەواو نابێ

نهێنیەکان بێکۆتایین

توخمی ئینســـــان

نامەکانی ڕابردوو

جەنگەکانی پێش مێـژوو

زەمەنی قافلەکان

گورگەکانی بیابان

مەرگەســـاتی - لم -

تاوانەکانی شـمشـــێر

هەمیشـە ئەخوێنرێنەوەو

ئەخوێنرێنەوە

حیکمەتێکـی جوانە

ئەشـێ تێفکرین سـەرەتای فەلسەفەیەکی دیکە بێ

ڕێدەکەوێ قەناعەت بە شـتێك بێنین
شـتێك ڕەنگە بە ( ژووری خەونـەکان )*
یان چاوەکانی یوســــــف بچێ
خەریکە سـەرێك لەتەنیایی ئەدەم
تەنیایی ،لە کانیلـەی تفتیلکەکانی ئاوایـی
پەرداخێ ئاوی بۆهێنام و پێیوتم :
سەدەیەکە کتێبێـك لێی نووسراوە،
هەمیشـە ولاتێك خەون ئەبینێ و
لە ئامێز فیلمێکی ڕەش جگەرە دادەگیرسێنێ
خۆشـبەختانە قەناعەتم بە – با – هات
ـ با ـ ی دەستی جەلاد وەك ئاگرێکی هەمیشەیی
لەسەرکورسیەکی ڕووت دانیشتووە
کە هەڵدەکات
ڕاست و چەپ ئەسوتێنێ ..
1998/12/20-1998/8/18

* ناونیشانی یەکەمین رۆمانی رۆمانووسی ئەڵمانی ( ئیریش مارییا ریمارك ) ە.

